# ڕاست و چەپ لە ئیسلامدا





نوسینی

مەلا ئادەمی باڵەک - وەڵزی



﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (الحشر: من الآية٧)

ئەوەی پێغەمبەر فەرمانی پێدان بە گوێی بکەن و قەدەغەی هە... ...ێکی لێ کردن مەیکەن و لە خوا بترسن چونکە بەڕاستی خوا ب... ...ی تۆڵە دەستێنێت.

﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ (النساء: من الآية٨٠)

...ەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات ئەوا بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای ...ە.

﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ (آل عمران: من الآية٣١)

پێغەمبەر بە بڕواداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ دە... ...ن من بکەون و دەرمەچن، ئەو کاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێ و ...واناە و هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت.

﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور: من الآية٦٣)

... ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر دەکەن بترسن لەوەی کە ...ی تاقیکردنەوەیەکی سەخت، یا ئازارێکی بە ئێش ببن.

# پێشکەش

❖ بەو خوشك و برایانە کە بەدرێژایی تەمەنیان هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا کارنامەی کارەکانیان بە دەستی ڕاست وەربگرنەوە و ڕوو سپی و سەر بەرزانە لە ناو ناز و خۆشیەکانی بەهەشتی بەرینی خوا نیشتەجێ بن و بحەسێنەوە.

❖ بەو موسڵمانە بەڕێزو تێگەیشتوانەی بەر لە ئەنجام دانی هەر کارێك ڕەچاوی ڕاست و چەپی کارەکە دەکەن و لەسوونەتی پێغەمبەر ﷺ دەرناچن .

❖ بەو خوشك و برا موسڵمانە بەرێزانە کە دەیانەوێ لەو سەردەمەدا سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ زیندوو بکەنەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان دا.

❖ بە بارکی بەڕێز و دایکی پر لە سۆزو خۆشی‌نەدیوم .

❖ بە کچی خۆشەویست و زیتەڵ و دەرس خوێن و دەرس بێژی قورئان و جوانەمەرگ و شەهیدم ئاواز خان .



## پێشەکی

## تەنها بەناوی خوای گەورەو باڵادەست

❖ هەر کەس تۆزێك لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ وورد ببێتەوە بێ گومان بۆی دەردەکەوێ کە مەسەلەی ڕاست و چەپ دوو ڕاستی سەلمێنراو و دەبێ هەر موسڵمانێکی دڵسۆزی ئایین و شوێن کەوتەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ زۆر بەڕێزو سۆزەوە ڕەچاویان بکات و لە تەواوی کارو باری ڕۆژانەی ژیانیدا بە ووردو درشتییەوە. نموونەش هێندە زۆرن لە ڕاستی دا هە ژماردنیان ئاسان نییە ، بەڵام ئەوەی سەر سوڕهێنەرە بێئاگایی موسڵمانانی ئەمڕۆکەیە لە سوننەتە بەڕێزو بە پێزەی پێغەمبەر ﷺ بە تایبەتی مامۆستا و چاو ساغ و بە ناو پێشەواو خوێندەوارانی ئەو سەردەمە. خۆ ڕاستی و حەقیقەتی ڕاست و چەپ تەنها پەیوەندی بە کارو باری دونیایی یەوە نییە . بەڵکو لەوەش زیاتر پەیوەندییەکی زۆر گرینگی بە دوا ڕۆژو سەرەنجامی حەشرو حیسابی هەر موسڵمانێکیشەوە هەیە و بگرە زیاتریش ، ئەوە نییە خوای گەورە

یاسای جودا کردنەوەی چاك و خراپەکانی لەو ڕۆژەدا بەدانەوەی کارنامەی کرداری هەر بابایەك بەدەستی ڕاست یان چەپ ڕۆناوە وەك ئەفەرموێ ( **فاما من اوتی کتابه بیمینه فیقول هاؤم اقرؤا کتابیه * انی ظننت انی ملاق حسابیه * فهو فی عیشة راضیة * فی جنة عالیة * قطوفها دانیة * کلو وشربوا هنیئا بما اسلفتم فی الایام الخالیة ) الحاقة ١٩-٢٤** ، واتا :هەر کەس نامەی کردارەکانی درایەوە دەستی ڕاستی (کەنیشانەی خۆش بەختانە) ئەوە بە ئاشکرا لە ناو خەڵکی هاوار دەکات و دەڵێ: **ها ها ئەوەتە کارنامەی** کردارەکانم دەی بیخوێننەوە خۆ من دڵنیا بووم لە دونیا کە بەو سەرەنجامە دەگەم جا ئەو کەسە لە ژیانێکی خۆش دا دەبێت و پڕ بە دڵ لێی ڕازیە ، لە ناو بەهەشت و باغێکی بەرزو خۆش دایە، میوەیەکی زۆری تێدایە، و زۆر بەئاسانیلێیدەکاتەوە، چ بە پێوە بێت یان بەدانیشتن یان بە ڕاکشان و پاڵدانەوە خوداش پێیان ئەفەرموێ : بخۆن و بخۆن لێرە هەتا هەتایە ئەوە پاداشتی ئەو کارە چاکانەیە کە لە دونیا کردووتانە . بۆ دەستەی دووەمیش دەستەی تاوان باران ئەفەرمووی؛ (**واما من اوتي کتابه بشماله فیقول یالیتنی لم اوت کتابیه * ولم ادری ما حسابیه * یالیتها کانت**

القاضية ) هەمان سوورەت واتا: ئەو کەسەش کە کارنامەکەی دەدرێتەوە دەستی چەپی (کە نیشانەی بەدبەختی و خەجاڵەتی ی) دەڵێ : خۆزگە کارنامەکەم هەر وەرنەگرتبایە وەو ئەنجامی کردەوەکانم هەر نەزانیبایە ئای بریا مردنەکەم لە دونیا یەکجاری بوایە و زیندو نەبومایەوە، بەڵێ ئەوەیە نرخ و ڕێزی ڕاست و چەپ لە تەرازووی دادگەری خوای باڵا دەست . بەڵام داخی گرانم نازانم موسڵمانانی ئەوڕۆکە زۆربەیان لە ئاست ئەو ڕاستیە سەڵمێنراوە ئەوەندە بێ ئاگان کاتێك لەو بارەوە پرسیاریان ئاراستە دەکرێت هەروەك بڵێی لە گوێی گادا نووستبن و هەر دەڵێی ڕۆژانەو مانگانەو ساڵانە تەنها جارێکیش ئەو ئایەتە قورئانی و فەرموودە خۆشانەی پێغەمبەریان ﷺ هەر نەخوێندۆتەوە و یاخود هەر گوێیان لێ نەبووە . ؟ سبحان الله . چەند غەریبە لەگەڵ زۆری و زەبەندەی ئەو هەموو دەقە قورئانی و فەرموو دانەی پێغەمبەر ﷺ کاتێك لەمامۆستایەکی ئەو سەردەمە دەپرسن ئایا ڕاست و چەپ لە نان خواردن و خواردنەوە پەیوەندی یەکی بە ئایین و سوننەتەوە هەیە؟ لەبەر بێ ئاگایی خۆی لە وەڵام دا دەڵێ: بە قەناعەتی خۆم جیاوازییەکی نییەو دەشڵێ :من خۆم گوێ بەو مەسەلە هەر نادەم

هەڵبەتە ئەوەم بە گوێ ی خۆم بیستووە لە مامۆستایەکی ناوچەکەمان ـ باڵەکایەتی ـ ؟؟.

زۆر سەیرە بابای پرسیار کەر کە پر سیارەکەی ئاراستەی مامۆستا دەکات هەڵبەتە مەبەستی ئەوەیە کە مامۆستا لەو شارەزاترە لەو بارەیەوە بێگومانیشە کە ئەوەی مامۆستا وەڵامی دەداتەوە ئاینی خوایەو بە ئاینیش وەری دەگرێ . بەڵام جەنابی مامۆستا زۆر سەیرە کە زۆر بوێرانە و نەترسانە ئەڵێ : بە قەنەعاتی خۆم مەسەلەیەك نی‌یە و یەکسەر بۆ چوون و قەناعەتی خۆی ئەکا بە یاساو ئاین و وەڵامی کابرای فەقیر حاڵی پێ ئەداتەوە کابراش وا ئەزانێ هەر ئەوەیە ئاینی ڕاستە قینە چونکە مامۆستا لەبەر چاوی ئەو ڕۆژانە چەند جارە پێش نوێژی بۆ ئەکات و هەفتانەش ووتاری هەینی بۆ ئەخوێنێتەوە و لە بۆنەکان و زەماوەند و پرسە و زۆر قسەی لووس و لەباریان بۆ ئەکات و بەسەر هاتی سەیرو سەمەرەو هورهێنەریشیان بۆ ئەخوێنێتەوەجا ڕاست بێت یا ناڕاست مەسەلەك نی‌یە لای ئەو ؟ کابرای نەخوێدەواریش بڕوای پێ ئەکات تا لەناکاو موسڵمانێکی خەم خۆرو دڵسۆز دڵسۆزانە ئاگاداری ئەکاتەوە کە برای بەڕێز ڕاستیەکەی ئاوا نی‌یە کە جەنابت لێی حاڵی بویت تا

ئێستا ، بەڵکو حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە خوای گەورەو پێغەمبەریش ﷺ باسیان کردووە ئیتر بەو شێوە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەری بۆ دەخوێنێتەوە بەڵام هێشتا کابرا نای سەلمێنی کە ئەوە ڕاستی یەکەیە چونکە هێندەی گوێ لە وەڵامی نادروستی ئەو مامۆستا بێ ئاگایانە بووە ناڕاستی یەکە لە مێشکی دا جێی خۆی گرتووە و ناش زانێ وەڵامی ئەو فەقیر حاڵانە هەر قەنەعاتی بێ بەڵگەی هەڵقوڵاو لە هەواو هەوەس و موتاڵانەکردنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ سەرچاوەی گرتووە .

جا بۆیە سەرنجی ئەو جۆرە مامۆستایانە ڕادەکێشم بۆ فەرموودەیەکی ئیمام علی ﷺ کە فەرموویەتی : ئەگەر ئایین بە (عقل ) بوایە دەبوایە (مسح) لە بنی خوف یان گۆرەوی کرابا یە نەك لە سەرەوەی ؟جا لەبەر ئەوەی چەند جارێکیش ئەو جۆرە پرسیارانە ئاراستەی بەندە کراون و منیش بەگوێرەی ئەو ئاگاداری یە کەمەی کە لە قورئان و سوننەت هەمە وەڵامی خۆمم پێ گەیاندون بەڵام هەندێکیان هێشتا قەنەعاتیان وەك پێویست بۆ دروست نەبووە و دڵیان ئۆقرەی نەگرتووە بۆیە بڕیارم دا کە هەستم نامیلکەیەك لەو بارەوە پێشکەش بە خوشك و برای موسڵمانی کوردستانم بکەم و

هیوادارم لەو نامیلکەیە دا هەندەك خزمەت بە گەلە موسڵمان و زۆر لێ کراو و خۆشی نەدیوی خۆمان بکەم بە پشتیوانی خوای گەورەو هەروەها ئومێدەوارم خوای بەسۆز بۆم بکاتە توێشوی دوا ڕۆژم لەو کاتەی کە هەموو بەندەیەك لەو پەڕی ئاتاجی دایە بۆ بەزەیی خواو کرداری چاکە ئەگەر تەنها بە ئەندازەی دەنکە خورمایەکیش بێت .

سوپاسی هەر خوشك و برایەکیش دەکەم کە هەڵەکانم بۆ ڕاست بکەنەوە چونکە کەس لە هەڵە پاك نی‌یە تەنها خوای تاك وپاك وبێ گەرد نەبێت .

والسلام علیکم ورحمە اللە وبرکاتە

نووسەر / شوێن شارۆچکەی قەسری ٢٠ ڕەمەزان ١٤١٩هـ ق ١٩٩٩ ز

ئێستاش ئێوەو ئەو چەند خاڵانــەی کڵم کردوونەتـەوە لـە بـارەی ڕاست و چەپ لە ئیسلام دا:

ڕاست و چەپ لە خوا پەرستی دا (العبادة) هەڵبەتەمەسەلەی ڕاسـت و چـەپ هـەموو بوارەکانی ژیانی داگرتـووە لـە ڕوانگـەی قورئـان و سوننەتەوە و زۆریش فراوانە جا بۆیە داوای لێبووردن دەکـەم ئەگـەر نەم توانی تیشك بخەمە سەر هەموو شوێنەکان بەگشتی ، جـا لەبـەر ئەوە بڕیارم دا بۆ زیاتر ئاسـان بـوون و فـراوان بوونـی بابەتەکـە بـە گوێرەی بابەکانی (فقهی ) بچمە ناو باسەکەو ئەگەر کەم و کورتیـش دەبوو ئەوا داوای لێ بووردن لە هەموو لایەك دەکەم لە دوعای خێریش بێبەشم مەکەن .

ئێستاش بابەیەکـەوە بچینـە نـاو باسـەکەو لـە بـابی (طـهارة) پـاك و خاوێنی .

١. چوونـە ئـاو دەسـت لـە هـەموو کتێبـە کـانی فقهی ئیسـلامی دا زانایـان ئەفـەرموون : سـوننەتە چوونـە ئاودەسـت بـە پـێی چـەپ دەستی پێ بکرێ و هاتنە دەرەوەش بە پـێی ڕاسـت بـە پێچەوانـە وەك کتێبـی (الفقــه الاســلامی وادلتــه ) بـەرگی ١ ل٢٠٢و الفقــه المنهجی ب ١ ل٤٩. قاعیدەیەکیان داناوە ئەفەرموون : (کل ما کان

من التكريم يبداء فيه باليمنى وخلافه باليسرى )هەروەها سوننەتە گرانـايى خـۆى بخاتـە سـەر لاى چـەپى ، چونكـە (طـبرانى) خ دەگێڕێتەوە لە سوراقەى كورى مالك كـە گوتويـەتى (امرنـا رسـول الله ﷺ ان نتوكاءعلى اليسرى وان ننصب اليمنى ) واتـا پێغەمبـەرى خوا ﷺ فەرمانى پێ كردين كە لەسەر ئاو دەست خۆمـان بخەينـە سەر لاى چەپ و لاى ڕاستەشمان بچەقێنين .

الفقه المنهجى ب١ ل٥١ والفقه الاسلامى وادلته ب١ ل ٢٠٢

❖ هەروەها لە كاتىدانيشتن دا بۆ ميز كردن نابىٔ پياو لەشى خۆى بە دەسـتى ڕاسـت بگرێـت و ناشبىٔ بـە دەسـتى ڕاسـت خـۆى پـاك بكاتەوە لە بەر ئەو فەرموودەيەى پێغەمبەر ﷺ كـە دەفـەرموێ : ( **اذا بال احدكم فلا يمس ذكرة بيمينه ، واذا اتى الخلاء فـلا يتمسـح بيمينه ، واذا شرب فلا يشرب نفسا واحـدة** ) رواه الائمـة السـتة عـن ابـى قتـاده الفقـه الاسـلامى وادلتـه ب ١ ل ٢٠١ وروى البخـارى ١٥٣ ومسلم ٢٦٧ عن ابى قتاده عن النبى ص قال: (**اذا بال احدكم فـلا ياخذن ذكره بيمينه ولا يستنج بيمينه**) الفقه المنهجى ب ١ ل ٥٢

❖ دەست نوێژ كرتن : سوونەتە لەدەسـت نوێـژ كرتـن دا دەسـت و لاقـى ڕاسـت پێـش بخرێـن لەسـەر لاى چـەپ بەلگـەشمان ئـەو

فەرموودەیە ( **عن ابی هریـرة ﷺان رسـول الله ﷺ قـال : (اذا توضاء تم فابدؤا بمیامنکم** ) رواه ابن ماجه ٤٠٢ الفقهـه المنـهجی ب١ ل ٥٩ هەروەها ئاو لـە دەم و لـووت وەرکـردن سـوونەتە بەدەسـتی ڕاست بێت بەڵام فرێدانی ئاوی ناو لووت دەبێ بەدەستی چەپ بێـت الفقه الاسلامی ب ١ ل ٢٥٢

٢. دانانی قـاپ و تەشـتی ئـاو لـە لای ڕاسـت سـوننەتە لـە کـاتی شۆردن. الفقه الاسلامی ب ١ ل ٢٥٥ الفقه المنهجی ب١ل٥٧.

❖ هەروەها سوننەتە پێش خستنی لای ڕاست لەسەر لای چەپ بۆ لە پێ کردنی پێڵاو و جل و بـەرگ و سـەرو ڕیش داهێنـان و شـانە کردن و دەست نوێژ شووشتن و خۆشوشتن و چـاو ڕشـتن و سـیواك کـردن و... وەك لـە فەرموودەیـەکی خـاتوو عائیشـە هـاتووە خ دەر دەکەوێ کە دەفەرمووێ : (**کان رسـول الله ﷺ یحـب التیـامن فــی تنعلـه وترجلـه وطـهوره وفــی شـانه کلـه** )متفـق علیـه. الفقـه الاسلامی وادلته ب١ ل٢٥٠ واتا : پێغەمبـەری خـوا ﷺ پـیێ خۆش بوو لای ڕاست پێش بخات لەسەر لای چەپ لە لەپێ کردنی پێڵاو ، سەرو ڕیش شـانە کـردن ، دەسـت نوێژ گرتـن ، خـۆ شـۆردن ، لـە هەموو کارێکی جوان دا ، سیواك کردن بـە دەسـتی ڕاسـت و لـەلای

ڕاستەش دەست پێ بكرێ. الفقه الاسلامى وادلتـه ب ١ ل٣٠٢ لـه فەرمایشتێكی تـردا فـەرمووی : **اذا لبســتم واذا توضئتــم فــابدوا بايامنكم** )رواه احمد وابو داود وابن ماجة و ابـن خزيمـة وابـن حبـان والبيهقى عن ابى هريرة. الفقه الاسلامى وادلته ب١ ل٢٥٠

٣. چوونـە نـاو مزگـەوت : سوننەتە لـە كـاتی چوونـە ژوورەوەی مزگەوت دا لاقی ڕاست پێش بخرێ و زیكری تایبـەتیش كـە بـۆی دانراوە بخوێنرێ و لە هاتنە دەرەوەش بە پێچەوانەوە. فقـه السـنة ب١ ل٢٦٩

❖ دابەستنی نوێژی ماموم لە لای ڕاستەی ئیمام ئەگـەر هـەر یـەك ماموم هەبوو بەڵگەشمان ئەوەیە. روى ابـن عبـاس ﷺ قـال : (**بت عند خالتى ميمونة فقـام رسـول الله ﷺ يصلـى فقمـت عـن يسـاره فجعلنى عن يمينيه** )متفـق عليـه. الفقـه الاسـلامى ب١ ل ٢٤٥ وفقـه السـنة ب١ ل٢٥٣ **واتـا** : شـەوێك لـەلای پـوورم مـەیموونـەی خـێزانی پێغەمبەر بووم ﷺ شەو هەستاوەو شەو نوێژی كردو منیش هەستام نوێژی لەگەڵدا بكەم ولەلای چەپی ئەو دام بەست ، بەڵام پێغەمبـەر ﷺ هەر لەناو نوێژدا ملیی گرتم و هێنـامیە لای ڕاسـتی ، ئـا لـێرەدا بۆمان دەردەكەوێ كە ئەگەر هاتوو هەر تەنها هەر ئەفەرێك دەست

کەوت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ (جماعة) لە دوای ئیمام ئەوا ئیمام بۆی هەیە ئەفەرەکە بێنێتە لای ڕاستی دای بەستبێ یان نا وەك پێغەمبەرﷺ لە گەڵ عبداللەی کوری عباس وجابردا نواندی .

❖ ٧- سوننەتە دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژ دا . بە ڵگەشمان (٢٠) فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ لە ١٨ هاوریێ بەرێزی پێغەمبەر ﷺ و دوو شوێن کەوتەش (تابعی ) یەك لەو فەرموودانە بۆ نموونە عن جابر ﷺ قال : ( **مر رسول الله ﷺ برجل وهو يصلي وقد وضع يده اليسرى على اليمنى فانتزعها ووضع اليمنى على اليسرى** ) رواه احمد وغيره. فقه السنة ب١ ل ١٥٨ والفقه الاسلامي ب١ ل٦٨٧ واتا : ئیمام احمدو هەندێکی تر ئەگێرنەوە لە جابر خ فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا تێپەری بەلای پیاوێك دا کە نوێژی دەکردو حال وابوو دەستی چەپی لەسەر دەستی ڕاستی دانابوو پێغەمبەریش ﷺ دەستی ڕاستەی گرتوو خستیە سەر دەستی چەپی ، هەندێك دەڵێن ئەو پیاوە عبداللەی کوری مسعود بووە ﷺ وروى مسلم ٤٠١ عن وائل ابن حجر ﷺ**انه راى النبي ﷺرفع يديه حين دخل فى الصلاة ثم وضع يده اليمنى على اليسرى**) الفقه المنهجي ب١ل ١٤٨ واتا :پێشەوای فەرموودە مسلم

ﷺ دەگێڕێتەوە لەوائل ﷺ کە پێغەمبەری بینیوە کاتێك نوێژی دابەستووە هەردوو دەستەکانی بڵند کردوون وپاشان دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی داناوە.

❖ ٨- شایەتی دان بە پەنجەی شادەی دەستی ڕاست و ئاماژە پێ کردنی و تۆزێك ئەوی کردنی بەلگەش ئەو فەرموودەیە (**عن نمير الخزاعي ﷺ قال : رايت رسول الله ﷺ وهو قائم في الصلاة قد وضع ذراعه اليمنى على فخذه اليمنى رافعا اصبعه السبابة وقد ضاها شيئا وهو يدعوا** ) رواه احمد وابو داود والنسائي وابن ماجة وابن خزيمة باسناد جيد. فقه السنة ب١ ل١٨٦ والفقه المنهجي ب١ ل١٥٤ ومسلم٥٨٠ عن ابن عمر ﷺ في صفة جلوسه ﷺ

٩- سەلام دانەوەی یەکەم لە نوێژ دا بە لای ڕاستە دا دەبێت ، بەلگەش ئەوەیە ئیمام مسلم ﷺ لە فەرموودەی ژمارە ٥٨٢ دا دەلێت: **عن سعد ﷺ قال : كنت أرى رسول الله ﷺ يسلم عن يمينه وعن يساره حتى ارى بياض خده** ) الفقه المنهجي ب١ ل ١٤١ واتا : سعد ﷺ ووتی پێغەمبەری خوام دەدی سەلامی دەدایەوە دوو جاران یەکەم بە لای ڕاستە و دووەمیش بە لای چەپدا ،

١٠.سوننەتە دوای تەواو بوونی نوێژ لە مزگەوتا هەر کەس ڕوو بکاتە ئەو شوێنەی ئیش و کاری لێیەتی ئەگەر ئیش و کارێکیشی نەبوو ئەوا بە لای ڕاستەی دا بڕوات لەبەر ئەو فەرموودەیەی عبداللەی کوری مسعود ﷺ کە دەڵێ : (**لایجعل احدكم للشیطان حظا من صلاته یری حقا علیه الا ینصرف الا عن یمینه لقد رایت رسول الله ﷺ كثیرا ما ینصرف عن شماله** )رواه مسلم. الفقه الاسلامی وادلته ب١ ل٨٠٨ واتا: عبداللەی کوری مسعود فەرموویەتی : ( با هەر یەك لە ئێوە هیچ بەشێك لە نوێژەکەی نەدا بە شەیتان ، پێویستە پیی وابێت کە لە سەری پێویست کراوە لە دوای نوێژ تەنها بەلای ڕاست دا وەربگەڕێ و بڕوات بێ گومان پێغەمبەری خوام بینیوە زۆربەی زۆری ڕووی لە چەپ وەردەگێڕا و ڕووی دەکردە ڕووی ڕاست .

١١. سوننەتە کاتێ بەندە بینی خەوی خۆشە ئاوڕ بە لای ڕاست دا بداتەوەو سوپاسی خواش بکات و ئەگەر ناخۆشیش بوو ئاوڕ بە لای چەپ دا بداتەوە و سێ جاران تف لە شەیتان بکات و تەنیشتیشی بگۆڕێ. بەڵگەشمان ئەو فەرموودانەن: فەرموودەی ژمارە ٢٣٨٢ لە پەرتوکی (الترغیب والترهیب)ی شیخ منذری بەرگی ٢ل٤٥١ عن ابی

سعيد الخدري ﷺ انه سمع النبي ﷺ يقول (**اذا راى احدكم الرؤيا يحبها فانما هي من الله فليحمد الله عليها وليحدث بما راى أو غير ذلك مما يكره فانما هي من الشيطان فليستعذ بالله من شرها ولا يذكرها لاحد فانها لا تضره**) رواه الترمذي. الترغيب والترهيب ب٢ ل ٤٥١ واتا :ابو سعيدى خدرى ﷺ دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ دەى فەرموو : ( ئەگەر يەكێك لە ئێوە خەونێكى خۆشى بينى با بزانێ ئەوە لە خواوەيە و با سوپاسى خوا بكات لەسەرى بيشى گێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر خەونێكى ناخۆش بوو ئەوە لە شەيتانەوەيە و با خۆى پەنا بدات بەخوا لە شەيتان و نەشى گێڕێتەوە ئيتر خەونەكە زيانى پێ ناگەيەنێ .

*فەرموو دەى ل٢٣٨ عن جابر ﷺ عن رسول الله ﷺ انه قال : (**اذا راى احدكم الرؤيا يكرهها فليبصق عن يساره ثلاثا وليستعذ بالله من الشيطان الرجيم ثلاثا وليتحول عن جنبه الذى كان عليه**) رواه مسلم وابو داود والنسائي وابن ماجه هەمان سەرچاوە ل٤٥١ ورياض الصالحين ٨٤٣ ل٢٨٨ واتا: جابر خواى ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى :( ئەگەر يەكێ لە ئێوە خەونێكى ناخۆشى بينى با ڕووى وەرگێڕێ بەرەو ڕووى چەپى داو سێ جاران

تف له شەیتان بكات و خۆی پەنا بدا بەخوا له خراپەی شەیتان٣جاران .

*فەرموودەی ژمارە ٨٤١ له پەرتوكی ریاض الصالحین ل٢٨٨فەرمووی : ( **اذا رای احدكم الرؤیا یحبها فانما هی من الله تعالی فلیحمد الله علیها ، ولیحدث بها وفی روایة : فلا یحدث بها الا من یحب** ) متفق علیه. واتا: ئەگەر یەكێ له ئێوه خەونێكی خۆشی بینی با بزانی له خواوەیه و با سوپاسی خوا بكات و باسیشی بكات وەلەریوایەتێكی تردا فەرمووی : با نەیگێرتەوه تەنها له لای خۆشەویستانی خۆی نەبێت .

١٢-١٣ دانانی نەخۆش له كاتی سەرە مەرگ دا سوننەته لەسەر لای ڕاسته دابنرێت و ئەگەر گیانیشی دەرچوو مردوو شۆر لای ڕاستەی مردووەكه بشوات ئینجا لای چەپی .بەڵگەش ئەو فەرموودەیه ( **وعن ام عطیة ان النبی ﷺ قال لهن فی ابنته زینب: ( ابدأنْ بمیامنها ومواضیع الوضوء منها** ) متفق علیه. ریاض الصالحین ل٢٦٠ژ ٧٢٣ الفقه المنهجی ب١ ل٢٤٧ – ٢٥٠ واتا :( ام عطیة) خ دەگێرێتەوه كه پێغەمبەر ﷺ له كاتی شوشتنی زەینەبی كچی كاتێ

مرد پێی فــەرموویـن : ( لــە لای ڕاســت و شــوێنی دەســت نوێــژی یەوە دەست پێ بکەن )

١٤-١٥ خواردن و خواردنەوەش سوننەتە بە دەستی ڕاســت بێت و بە دەستی چەپ قەدەغە کراوە، بەڵگەش ئەو فەرموودەیە (عـن ابـن عمر ﷺ ان رسول الله ﷺ قال : **لاياكلن احدكم بشـماله ولا يشـربن بها فان الشيطان ياكل بشماله ويشرب بشماله** ) قــال : ( وكـان نـافع يزيد فيها (**ولا ياخذ بـها ولا يعـط بـها** ) رواه مسـلم والـترمذى بـدون الزيـادة ورواه مـالك وابـو داود بنحـوه. الـترغيب والـترهيب ٣١٢٠ب٣ ل٥٧-٥٨ . واتا : ( دەگێرنەوە لە عبداللــەی کوری ئیمـامی عومـەر ﷺ کە پێغەمبەر ﷺفەرمووی ( نەکەن کەستان بەدەستی چەپ شت بخوات یان بخواتەوە ، چونکـە بەڕاسـتی شـەیتان بەدەسـتی چـەپی دەخوات و دەخواتەوە عبداللــە وتـی : نـافع ئەوەشـی زیـاد دەکـرد نابێ شتیشی پێ ببەخشێ یان شتی پێ وەربگرێت .

- فــەرموودەی ٣١٣١ هــەمان ســەرچاوە، وعـن ابـى هريـرة ﷺ ان النبى ص قال : ( **لياكل احدكم بيمينـه ويشرب بيمينـه وليـاخذ بيمينه وليعط بيمينه فان الشيطان ياكل بشـماله ويشـرب بشـماله ويعطى بشماله وياخذ بشـماله** ) رواه ابـن ماجـه باسـناد صحيـح

واتا دەگێرنەوە لە ابو هريرە ﷺ كە وتى : پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ( با هەر كەس لە ئێوە بە دەستى ڕاستى بخوات و بە دەستى ڕاستى بخواتەوە و بەدەستى ڕاست وەربگرێ و بە دەستى ڕاست ببەخشێ چونكە بێ گومان شەيتان بە دەستى چەپ دەخوات و دەخواتەوە بە دەستى چەپيش وەردەگرێ و دەش بەخشێ )

١٦ـ تەسبيحات كردن بە دەستى ڕاست دەبێت نەك بە دەستى چەپ يان بە هەردوكيان بەڵگەش ئەو فەرموودەيە : عن عبدالله بن عمرو ﷺ قال : ( رايت رسول الله ﷺ يعقد التسبيح بيمينه ) حصن المسلم اخرجه ابو داود في مسنده بلفظه ب٢ ل٨١ والترمذي ب ٥ ل٥٢١ وانظر صحيح الجامع ب٤ ل٢٧١ برقم ٤٨٦٥ واتا ابو داود و ترمژى دەگێرنەوە لە عبداللەى كورى عەمر ﷺ وتى: ( پێغەمبەرم ﷺ بينى تەسبيحاتى دەكرد تەنها بە دەستى ڕاستى .

تەواو بوو

ئەوە بوو کەمێك لەبارەی ڕاست و چەپ لـە ئیسـلام دا هیـوا دارم خوێنـەرە بـەڕێزەکان سـوودی لێ وەربگـرن و دوعـــای خـێریش بـۆ بـەندەی گوناهکـار بکـەن بـەڵکو خـوای گـەورە ومیـهرەبان بـــەهۆی دوعای ئەوان لێم ببورێت

تێبینی / هەڵبەتە لە ڕوانگـەی چـەند دەقێکـی قورئـانی وسـوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆمان ڕوون بۆوە کە مەسەلەی ڕاست و چەپ شـتێکی سـەلمێنراوە و نـابێ موسـڵمان ئاگـای لێ نـەبێ و گـوێی پـێ نـەدات بەڵکو پێویستە زۆر بە دڵسۆزی ڕەچاوی بکات و لە ژیانی ڕۆژانەی دا پەیڕەوی بکات و کـاری پـێ بکـات ،چونکـە دەسـت گرتـن بـە ڕێ و ڕەوشت ( سنة)ی پێغەمبەر ﷺ گوێ ڕایەڵی‌یـە بـۆ فـەرمانی خـواو پێچەوانەکەشی دەبێتە گوێ نەدان بە فەرمانی خوا ﷻ بەڵگەش ئەو فەرمودەیە کە(أبو هريرة) ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی : **(من أطاعني فقد أطاع الله، ومـن عصـاني فقـد عصى الله)** رواه بخـارى ٧١٢٧ ومسـلم ١٨٣٥ واتـا: هەرکـەس بەگوێی منی کرد ئەوا گوێ ڕایــەڵی خـوای کـردوەو هەرکەسـیش سـەرپێچی منـی کـرد ئـەوا سـەرپێچی فـەرمانی خـوای کــردوە.

رياض الصالحين ل٤٨٣ له فەرموودەيەكى تريشدا فەرمووى "
( ومن سن في الأسلام سنة سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها من بعده من غير أن ينقص من أوزارهم شيء) رواه مسلم ١٠١٧ عن أبى عمرو جرير بن عبدالله . واتا : وەركەسێكيش ڕەوشتێكى ناشرين - پێچەوانەى ڕەوشتى پێغەمبەر ﷺ - لەناو ئيسلامدا پيدابكات ئەوا كوناه وتاوانى خۆى و ئەوكەسانەشى لەسەرى دەنوسرێت كە چاويان لەو كردوەو لاساييان كردۆتەوە لەدواى ئەو بێ ئەوەى هيچ شتێك لە تاوانى ئەوان كەم بكاتەوە.رياض الصالحين ١٦٦ بەلام لە هەمان كاتدا نابێ بشكرێتە فاكتەرو هۆكارێك بۆ زياد لە پێويست باس كردن و يان بكرێتە هۆى كێشەو بگرەو بەردە و دڵ ئێشان و سەر ئێشەو تێكدانى شيرازەى برايەتى و خزمايەتى و دۆستايەتى و دراوسێيەتى چونكە ژيانى پێكەوە ژيان بە برايەتى و خۆشەويستى و ڕێز لێكنان (اصل)ە و ڕەسەنە

وصلى الله وسلم وبارك على حبيبنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

نووسەر : ملا ادم ى باڵەك وەڵزى

٢٠ى رەمەزان ١٤١٩هـ ١٩٩٩/١٢/٢٨ز هەولێر /زانايان

والسلام عليكم

# سوپاس و پێزانین

﴿ و من لم یشکر الناس لم یشکر الله ﴾

له ناخی دڵمەوە سوپاسێکی زۆر زۆری برای بەڕێز و دەست واڵا لە کاری خێر و چاکە کاک - **حاجی زرار حاجی سعدی باومقوبی**- دەکەم کە یارمەتی دام بۆ کڕینی ئامێری کۆمپیوتەر، له خوا دەپاڕێمەوە کە لە جیاتی بەندە پاداشتی هەزاران بەرامبەری بداتەه